


**سەفەری سوێ**

**قادر فەرامەرزی**

**رووبەرگ: شۆڕش ئاهی**

**لۆگۆ: سولەیمان رەحیمی**

**ناشر: پیام امروز ـ تاران**

**چاپی یەکەم ١٣٨٢**

**ئەژمار: ٥٠٠ بەرگ**

**پیتچن: محەممەدئەمین شاسەنەم** «☎ ٦٢٢١٣٤٠ بۆکان»

**چاپ و صحافی: امینی ـ تاران**

**شابک: ٩٦٤-٥٧٠٦-٣٠-٠**

---

نشر پیام امروز: تهران، خیابان انقلاب، خیابان فخررازی، بعد از لبافی‌نژاد، شماره ١١١، تلفن ٦٤٩١٨٨٧

ئێستا و هەمیشەم

بۆ

دڵە **ئاسمان**ییەکەی **فریا**

و

چاوە **دەریا**یی‌یەکانی **دەریا**؛

دوو هێزی وشە و ژینم؛

تا

**ماک**...

**تێبینی:**

ـ ریز کردن و دابەش کردنی شێعرەکانی ئەم کۆمەڵە شێعرە پەیوەندی بە زەمان یا هیچ تایبەتمەندییەکی شێعرییەوە نیە.
ــ وەک دەبینن رستەی سەرەتای هەر شێعرێک ناوی شێعرەکەشە، ئەمە تەنیا لە بەر ئەوەیە کە نەمتوانیوە نێوی زۆربەی شێعرەکان بنێم چونکە بە راستی ـ نێودانان لە سەر هەر شتێک ـ بە لامەوە دژوارە.
بەر لە من ئەم کارە چەند شاعیرێکی فارسیش کردوویانە.

ق ـ ف

# ناوەرۆک

# سەفەری سەرەتاکان

# لە جێیەک

لە جێیەک
(شوێن) من دەبینێتەوە
بۆ دالْدەم.
من کە نەمزانیوە
دەستی قەترەم
لە دەستی کێ هەتلْە ـ نازانم ـ
یا
دزراوم .
منی دوور... دوورە ولْات
بەرەو خاک
دیسان
بەرەوخۆم.

# نا بارێ نا

نا بارێ نا
بە دیار هەڵوەشانی
پەڵەیەکەوە.
نا
نە دەبارێ و
نە مەرگیش . . .

دەستەکانی بەرەو دۆعا
چ بەی دەست
تەمای تەڕ بوون!
چەندە چەتر!
چ ڕێژەیەک
لە سەرابی بارشتێکدا!!.

# پاڵ مەدەوە

پاڵ مەدەوە
بە منی خەفەت
تەفرەی هەندێک
بزەی بزر
دەتوانی؟
تا هەل هەیە.

لێرەش باخچە؛
واتە: پاشکۆی
هەندێک خۆشی.

## بۆ زەمەنترین پێکەوە بوون

بۆ زەمەنترین پێکەوە بوون
مۆمێک
بۆ شەپۆلترین پێکەوە گلانیش...
+ قژەکانت،
+ کاروانی ماندووی پەنجەم.
شێوەی جاڕی ژێر بەفر دەکا

بەهار
لە ژێر پێستی کارەساتەوە
خودایە..خودا.

# خەواڵووترین

خەواڵووترین
ـ پەنجەی ئارامش،
منی ڕابردوو..و
خەیاڵانی شێواوت
درۆ!
باڵەخانەی دۆڕاو,
دەلەسەی سەپاوی
من و
حەز و
تۆ
خەواڵووترین ڕاستی
ڕاستترین درۆ.

# گومانی تاریکی

گومانی تاریکی
ڕوون ، ڕوون
چاوت بە شوێن پەنجەتەوە,
بە دوای بزەیەک ڕووناکاییی
ئێستا
بێ‌گومان.

# چاوەکانی کەو

چاوەکانی کەو
لە دۆعا دا.
باڵەکانی دۆعا
لە بێزمانی و پسکی دا.
پاڕانەوەی کەو
لە ناوەختی و
پەنجەکانی لە ئامێزی داو دا
ڕوویان دا.

# دەنگ دەڕژێ

دەنگ دەڕژێ
پێڵووی خەواڵووی نیوە شەو
ڕاکشا و
بە سەر تاسەی بێدەماری
ماتەمینی تەمدا.

دەنگ دەشێوێ
لە ئابڵۆقەی بێدەرەتانی

شەو و
پەتای بێکۆتایی
ترس.
سیمای هەڵپڕووکاوی مانگ
ڕەشێکی گەشتر دەخوازێ
بۆ گەشانەوە.

سییەکانی ئاسمان
پڕ لە شنەی شێواوی دەنگ.

# دەستەکانت

دەستەکانت
لە ئاخرین کۆڵانەکانی
بەرەو هەڵدێر
دەست پێدەکا و
نیگاکانم
بەر لە بێدەنگی ئاسمان
خامۆش دەبن.
ئێمە ئا لێرەین
(لە) هیچ کوێ.

# ڕێگا هەوراز و

ڕێگا هەوراز و
ڕێبوار هەورازتر
ـ بیر لە چی دەکەیتەوە؟ ـ
من خەواڵوو
تۆ خەواڵووتر
ئێمەی بەرەو نوێنی نەرم و تازە...!

# لە دەست چوون

لە دەست چوون
ئەوانەی
کە دەستەکانت؛
لە گوڵدانی لەشتەوە
هەڵبڕی.

ون بوون ون
ئەگەر چاوەکانت
نەیپشکنین
هاوڕێیانی ئاوارەیی.

# چۆنە وەڕێ ناکەوێ

چۆنە وەڕێ ناکەوێ،
پەنجەکانت
هەرێمی ساز
ئاوێتەی ئاوا بوونێکی؛
لێلایی ئێوارانە.
لە خۆفێکی بێبن دا
سەرەنگرێ دەدا
لە ترساوترین خشپەی
داخورپاوی نیوە شەو
چەندە سەوزە تاریکایی!
ئاشنایە
خۆفی چۆلگە
پەنجەکانت
ئاوەڵدوانەی کامە سازن.

# دژواره

دژواره
باڵندەی هەناسەت
حەزێک ئاسمان و
پێیەک
هێلانەی وێرانی
دێرین.
پەتای مەرگ
حەزی شمشاڵی بێتاوانی
هەناسەتە و
ئاهـ هـ هـ
تۆ
لە پێناوی
پێوانی
توانەوە دای.

# تەمێک لە هێمای

تەمێک لە هێمای
حەزرەتی هەناسەم
ئەگەر بڕەوێ.
مۆری بڕانەوە و
کۆتایی
چاوەڕوانیەکانی
دوور
دوورم
لە نامەی
(ئیتر بەستە)ی

ئەم گێژاوی
ساڵانە دە!
پارچە سوورەکانی
هەموو تاسەی
هەموو تەمەنێکم
خودا!
لە بەرۆکی
نووری بزە و
ڕزگاری دە!.

# هەوای پێدەشت

هەوای پێدەشت
شڵەژاوی باڵی هەڵۆ
هانکە هانکی هانای
هەناسەی نێچیر
تێکڵاوی
هەناوی هەڵۆ
هەوای چیا
بەری لە سییەکانی
نێچیر.

## تیغی نیگا؛

تیغی نیگا؛
دیوار شەق دەبەستێ و
زیندانی
چ ساویلکانە
پێدەکەنێ.

# چۆن بژی مەرگ

چۆن بژی مەرگ!
نمەی یادی نایەتەوە
هەرگیز
ئێوارەی باران

لە نمەی چاوەکانتدا
بیری پیاسەی پێکەوە بوونمان
هەرگیز
بڵێی بڕوێ؟
چ ئارام
دەپارێزێ
خاک،
ملوێنان ساڵ.

بۆ:

*شەوانی تەنیاییم لەگەڵ شەپۆلی نیانی دەنگی «عەباس کەمەندی»*



# ویرەکانی با

# هەندێک پیری؛

هەندێک پیری؛
بە ڕوومەوە .. زوو باریوە؛
زستان
گەمژەیە..گەمژە
باوەڕت بێ!

بڕێک لاوی..هەر؛
یادی ماوە
بە ڕووخساری سەرسنوورمەوە
بڕوا بکە!

وردە وردە
لەم نزیکانە
زۆر دووووووور
دەبمەوە
دەمبیستی؟!!.

# نامهەوێ

نامهەوێ
لە جودایی باخ دا
سۆزی پاییزی
هەڵوەران بم.
لە جودایی ماچ دا
نا..من نامهەوێ
ماچی جودایی
بە تەوێڵی یادی دووری بم.
نە باخ بێ شنە؛
نە ماچ بۆ جودایی
دەخوازم.
من
نە... (نا)!.

# تەمای ئەوەم نەماوە

تەمای ئەوەم نەماوە
لە دڵدا
تۆ
بەلەمێکت بە دەستەوە و
قومێک ئاوت...
تەمای وشکاوی ڕووبارەکانم
لە دڵ نەماوە
تۆ بە تەنیا و
تەنیا بەلەمێک

لە خامۆشی مندا
مانگی داخورپاوی
شەودرەنگانی هاوین و
سیلەی چاوی بەر بنار
لە بەرۆکی تەنیاییت دە و
منی بەرەو دڵاوایی بێدەنگی و
تۆی ئاوێزانی
شەوبای
یادی منی
دەمەو پاییز.

## جگەرەیەک

جگەرەیەک
تەسبێحێک
خەیاڵێکی بەتاڵ
وشەیەک
دوو..سێ..پێنج..دە
شێعرێک
وێرەیەک... گۆرانیەک
خاڵی کردنی (ببوورە) بایەک
..............................
...........................
ئاخ چەندە تەنیایی!!

ـ نوقمم ـ
پەنجەکانی بێئارامیم
لە گینگڵی نیوەشەو و... .
ـ بێبزەیەک ـ
هەر چوار پەلم
لە خەساری حەسانەوە.
تنۆک ؛ تنۆک
هەڵیان دەدەم
وردە شووشەکانی
تەنیایی چڕژاوم.

# له بیرم دا

له بیرم دا
هەر چرکەیەک
ئەگەر دزە دەکات
مەرگ و
دەزێ.
له چاوم دا
فەرامۆشی
جووتێک مەمکی
تەنیا و تەریک؛
نامرێ و
دەژی
بزەی نیگا.

# حەسرەت

حەسرەت
بۆ کاسترین
کاتە زرینگاوەکانی
شەو,
کە داییم
لە خامۆشی و
بێئاگایی ئێمەدا
ڕادەبوورن.

## دەنگم بە گۆرانییەکان.

دەنگم بە گۆرانییەکان.
هەنگاوەکانم
بە دەریا.
تەمەنم ڕەنگە
بە هیچ
بە هیچ ڕانەگا.

# تۆ لە غەڵبە غەڵبی

تۆ لە غەڵبە غەڵبی
بێدەنگییەکی چڕ دا ون بووی
من
لە خامۆشی
چریکە غەریبەکانی
وشە بەستەزمانەکان دا.
ڕۆژێک دەستەکانم
ئاوێزانی
تەوژمێک بای حەسرەت دەبن
لە پەیکەرەی
مەرگێکی بێوادە دا.

# چەندی لە ماچ بدوێم

چەندی لە ماچ بدوێم
باری باخی لێوم
وشکەڕۆتر
باسی بارانی بە غوڕەم
دەخوازێ.

چەندی باسی باران بکەم
وشکەڕۆتر
باخی باری لێوم
ڕێژنەیەکی ماچ
دەخوازێ.

# زیز دەبم

زیز دەبم
وەک سیس بوونی باخ
لە عەزرەت:
عەشقی بێبڕانەوەی باران.

سیس دەبم
وەک زیز بوونی عەشق
لە ژوانی
بێچرپە و
بێچپەی سکاڵا.

# هەراسانم

هەراسانم
تا
هەرەسی مەرگ
لە ژیان.

چ بێئاگا
چەندە سادە
تێدەپەڕێ
تا
دادەسەپێ مەرگ
ژیان.

# ترسی دەرچوونی زەمانم هەیە

**ترسی دەرچوونی زەمانم هەیە**
**لە بێئاگایی و**
**مەستی رستەم دا.**
**ترسی نابەجێ بوونی**
**خەو و**
**فەرامۆشی**
**خۆشویستن**
**لە درەنگترین ساتە وەختەکانی**
**عاشق بوون.**

## دوور دەبمەوە

دوور دەبمەوە
لە تێکلاوبوونەوەی
پەنجەکانم.
بێگانە لە ڕووناکی
پێکەوە بوونی ئێواران.

ژەهری تازەی
چارەنووس
بە ئەرخەیان بوون و
ئاسوودەیی
و
ئارامشی نوستووم
دەسپێرم.

هەموو بەیانی‌یەک
خەواڵوو
هەواڵی تازە
لە تەنیایی و
لە سێبەری بزۆزی گەڵای درەخت و
لە بێدەنگی هەموو چرکەکانم
دەپرسم.

# بیر ؛ کەس لە باران

بیر ؛ کەس لە باران
ناکاتەوە.
بای سەر چڵ دێت و
تێدەپەڕێ.
ڕێژنە بیر
لە:چەتر و
پرد و
بەردەباز
ناکاتەوە.

# مشتێک گوڵی هەڵوەریو

مشتێک گوڵی هەڵوەریو
بە دەس ئێنتزاری
نیگایەکەوە دەدا
قەتارێک.

هەندێک خۆشی دەگمەن؛
خەونووچکەیەک،
دەتباتەوە و
لە هەموو
چاوەڕوانییەکدا
جۆرێک
لە شێوەی دڵشکان و
بزەیەک
بەرەو سست بوون!

# کات لە یادتدا

کات لە یادتدا
دەخەملێ
وەک منی ئەو دەم
بە نیازی نیازێکی ساویلکانەوە؛
هەڵمژینی ئێوارەیەک
هەوای تۆ.

سادەتر
تۆ
لە قووڵایی رۆچوونی
وڵاتێک کە ـ خۆت ـ
لە نوقم بووندا
لە
لە هیچ.

# ڕۆژێکی سەر بەمۆر

ڕۆژێکی سەر بەمۆری تۆ
خەریکە
دەخوێنمەوە.
ڕاچڵەکان تا حەزی دیدار
تا (.)
ـ خەونەکانت
ببوورە
بمبوورە
ـ تەنیاییشت.

ئەم شەو
ڕۆژێکی سەر بەمۆرت
بە ماچێک
بە سەد
بە هەزار ماچ
بە . . . (.)
دەسپێرم.

# سەفەری کۆچ

## هەڵدەچێ

هەڵدەچێ
لێو ڕێژیم.
تۆ تاشە بەردێک
ئاوەڵدوانەی
تەمت... .

بێهوودەیە!
سەودای ئاسمانێک
نەبێ
سریوە و ڕاخوشان.

## تکا دانابڕێ

تکا دانابڕێ
هەنگاوەکانت لە سەفەر
ببوورە
دەوامی هەنگاوەکانت
لە ئاوێنەی سەر ڕێگا بنێ

من
تەم و مژی ئەو بەرت
بە دیاری...
بە دیار گەڕانەوەت
لە ئێرەم
ئا لێرەم!

# قووڵایی باخ

قووڵایی باخ
لە هەناوی هەنار دایە و
ژانەکانی ڕیشە نابیستێ
سەرچڵی گەڵا.

لە وێستگەیەکدا
دادەبەزێ,
دڵ
خولیاکانی سەفەر
نەناسێ

# له بیری چاوم دا

له بیری چاوم دا
ڕوانینت نه‌ماوه
له بیری په‌نجه‌م
مه‌مک و
په‌نجه‌ت

پاییزه و پاییز
گه‌ڵا و گه‌ڵا.

# سەودای شاخ و

سەودای شاخ و
بۆنی گوڵی تازە ڕواوی ,
دەمەو پاییزم
لە دڵدایە... و
سەرناگرێ ,
نا. . هەر
زستانە
لە بەر دەرگا.

# دڵی نەهات

**دڵی نەهات**
**درەختە سەوزەکان**
**بداتە دەست**
**سیمای سڕی زستان.**
**عاشقە.. پاییز**
**عاشق.**

## سەفەر

سەفەر
تاڵترینماڵاواییە و
پردە ڕووخاوەکان
هەنگاوێک شک نابەن
بۆ گەڕانەوە.

# ڕێیان نەدا

ڕێیان نەدا
بۆ سڕینەوەی شەکەتی
لە سای ئاسوودەیی
سێبەرێک
بە دەم شنەی نیانی
پشوویەکەوە
قاچە ڕێبوارەکانی
سەفەرت.

## پڕ بووی لە ئاسمان

پڕ بووی لە ئاسمان
هەناوی نیوەشەوت
پڕ لە جریوەی
خەمە وردیلەکانی
بێدەنگی و
کپی؛ ڕۆژە یەک ڕەنگەکانی
بەفر و
تەنیا
جێگاپێیەک
سەفەر.

# پێکەنینتم

**پێکەنینتم**

**بەر لە گریانت**

**نا؛**

**ناوێ**

**چاو لە ڕێگای گەڕانەوەت**

**چۆن؟**

**بەر لە سەفەر کەم.**

## هەتا بڕوانێ

هەتا بڕوانێ
نیگا
چ بەهارێکی باڵا خەملیوە!
ژووانی تاقە پشوویەک.

چ تاقانەیەکی بزێوە
لە ڕووبار و
لە دەریاوە.

تاقە
تاقانەیەکی بێدەرەتان و
بزێوە ؛
بە تەوێڵی چارەنووسی ڕێگاوە.

# لە چۆڵگە دا ڕێگا ماندوو

لە چۆڵگە دا ڕێگا ماندوو
ڕێبواری دڵاودڵی
ڕۆیشتن و
مانەوە.

دێوەرەی ڕێگای ماندوو
لە پشوودا و
ڕێبواری سەفەر
لە پشووی ڕێگا دا
ماندوو.

## یادێکی دەگمەن

یادێکی دەگمەن
دەتپارێزێ لە تێداچوون
کۆڵانە کۆنەکان
ناناسنەوە
دڵەخورپەی هەوای ئەو دەم.

پەنجەی بە ئاستەم
بەرەو ئیما
ئاخ
ئەم بلووری تاریکستانە
کەی
دەچڕێ!

# گوڵ نا

گوڵ نا
دڕکیش
ـ هەندێک نیانتر

ئاسمان نا
زەویش
ـ هەندێک خوارتر

هەموو
هەموو شتێ
تۆزێ . . هەندێ
بڕێ . . بە ئاستەم
ئاستەم (تر)

# جۆرێک چاو

جۆرێک چاو
لە بیری دیتندا نامێنێ.
چۆن دێیتەوە یادم
لە دووپاتەبوونەوەی دیدار
شەونامەیەک
یادی دەلکێ
بە تەوێڵی دووری
رابردووەوە
مۆمی کۆتایی شەو
بە موژدەی نوورەوە
تێکەڵ
بە جۆرێک سەمای
شنەی بەیان.

**سۆزی سوێ**

# دادەنیشم

دادەنیشم
بە دیار بێسەر و شوێن چوونی
ڕووبارێکەوە.
بە شوێن منی
بە دیار ڕووبارەوە
مەچۆ
بێسەر و شوێن
چ تاڵ تاریک دادێ
بێتۆ
ئێوارەیەک.

# چاوەکانم

چاوەکانم:
بە قەد ڕووبارێک.
دەستەکانم:
بە قەد باڵای دۆعایەک.
قاچەکانم:
بە قەدەر
دووری کۆچێک،
چاوەڕێی
گەڕانەوەت دەکەن.

## تێکەڵ بە دەستەکانی

تێکەڵ بە دەستەکانی
با دەبوو.
تێکڵاوی
خاک و خۆڵی
سەرڕێ
سەربان
کانی و
ڕووبار و
دەریا و
تەنانەت
چەترەکەی دەستت.

# بەر لە حەزی من

بەر لە حەزی من
گوڵەکانی باخچە یادت دەکەن
بەر لە زەردی و
هەڵوەرین؛

پێش وێرانی و تێداچوون،
ماڵ ئاوا!!

# جۆرێک ــ با بڵێم ــ

جۆرێک ــ با بڵێم ــ
نیانتر ــ تەنانەت ــ
لە مەندیت.
شێوەیەک ــ ڕووناکتر ــ
لە ئاشناییت.
لێرەوە

تا ئێرە

تا ئێرە بێدەنگی
من ــ تۆ بڵێ ــ
چۆن؟
چۆنتر؟؟
......
.......

# بە پیرمەوە

بە پیرمەوە
پیر ؛ پیر دەبی مەیە.
گێژەڵووکە ؛ چەندە هێمن
پاش نیوەڕۆی خەونەکانت
دەشێوێنیٚ.
بە دیار پیریمەوە
پیر دەبی
دامەنیشە.

# لە بیری دەستت دا

لە بیری دەستت دا
پیاسەی شەقامی شەودرەنگانی
قژم نەماوە
خولیایی لێوم
لە بەرەو یادی ــ جار و بارەی ــ
هاڵاوی لێو و
ڕوومەتی لای ئێوارەتدایە و
چ بێسوود
تۆی فەرامۆش کردووی
هەموو پێکەوە بوونێکی یاد
چەندە پاییز
چەندە بەرەو مەیلی گەڵا!!.

# شڵەژا

شڵەژا
وشەی نامۆ
لە ئاشنایی دڵم دا.
بێئۆقرە
لە سڕینەوەی
هەوای ژاری خەفەت.

من پاڕانەوەی گوڵ
بە سوغرە دەگرم
بۆ ئاکامی ئاشنایی

کڵپەیەک عەشق
ئاسمانێک جمەی
وشەی نامۆ و
ئاشنا
بارمتە دەگرم.

کۆمای نزای
چپەی جێژوانەکان
بە فاڵی باڵات دەگرمەوە.
ئاشناترین!

# لە کوێوە

لە کوێوە
لە کام ڕوانینتەوە
چەکەرەی تازەی هەڵچوون بووم
چاوە غەریبەکانت
ئاشنایی من دەپێون
یا
لە گەڵ نامۆییت
ئاشت دەکەنەوە.
غوربەتی یاخی
لە چاوە ئاشناکانتەوە
دەتکێ.
بڵا،
دڵی گوشراوی خەمت
ئاوەدانی بزەیەک.

# چەندە فێنکایی

چەندە فێنکایی لە سەر داماوە؟
شاخ
یادی غونچە
کەی دەپشکوێ؟
لە کوێوە زەمان؛
حەپس دەکرێ , تا کوێ
لە نێوانی دوو کەوان ( )دا
کەوانێکی تر کەی؟
کەوانێکی تر چۆن؟.

# میوەی درەختی دڵت

میوەی درەختی دڵت
خەمە و
باخە بەهەشتیەکانی
نیگات
لە حەسرەتی چ ماتەمێک دا
دەڕژێن؟!.

## چ ناڵەبار

چ ناڵەبار
باری , بارشتی ڕەش
باخی باوەشم
دابڕا لە تۆ
لە تریفە
لە بێدەنگی دوای سکاڵا
لە تۆی نەباریو
بە سەر شانی شەوانی
تەنیاییم دا.

زوڵاڵترین
بەیانی‌یە
ــ با ــ
لە کۆڵانەکانی
حەنجەرەت دا.

# ئەگەر باخ

ئەگەر باخ
لە تۆوە...
شەونم ترین سڵاو
پاییز , بەڵام
هەر دەڕوات

هەر دەڕوات و
دەڕژێ.

## له چاوت دا

له چاوت دا
دڵم چرژا و
له خوێنم دا
شەپۆل دەدا
وردە شووشەی
عەشقێکی کۆن.

# شەونمی هەناسەت

شەونمی هەناسەت
لە باخە ئاسمانیەکانی
دڵم وەرێنە
دیسان پاییز
بەڕێوەیە.

# وێرانە... وێران؛

وێرانە... وێران؛
باخی تەماوی نیگات
زریانی چ هەواڵێک
لێرەوە تێپەڕیوە.

پەپوولەکانی بیرت
پەرەوازەتر
لە وشەکانت
لە بێدەنگیتدا.

# خوێنی تۆڕان

خوێنی تۆران
له دەماری؛
هەموو وشەکانت دایە و
لە هەموو
ساتەکانی من دا
ئاشتی.

# گەڕانەوە

گەڕانەوە
گینگڵ دەدا
لە خەونووچکەی
شەوانت دا
چاوەڕێییم ؛
باوێشک.

مەستی وشە و
یاغیگەری شێعرت دەکەم ,
ئەگەر بە ئاگای.

ئاگاداری
ترپە دەستەمۆکانی
دڵمت دەکەم
ئەگەر مەستی.

## لە بیرم دەچێ

لە بیرم دەچێ
لە بیرم بمێنی
ئەو دەمانەی تەنیاییم
لە گەڵ
خۆرەتاوی بەیانی و
شەقامی ئێوارە و
بزەی منداڵەکەی
باوەشی دایکی دا
کە دابەش دەکەم.
لە بیرم دەچێ
لە بیرم نەچی.

# دادەبەزێتە

دادەبەزێتە
کۆڵانەکانی تاریکی
ڕابردوو،
سۆمای کزی بیرێک.

بە سەر ڕێگای
نیوەشەوی
زمانم دا
تریفەی شێعرێک.

## وەرە با؛

وەرە با؛
کۆنترین چیرۆک
بۆ باخە سەوزەکانی چاوت
بگێڕینەوە

بەڵکوو ئەم پاییزە
زوو تێپەڕێ.

# دەستەمۆ نابن

دەستەمۆ نابن
ماڵاوایی و
غوربەت و
کۆچ
نامگرنە خۆ
وشە یاغی‌یەکانی
سەر دەمانی
پێکەوە بوون.

# پەنجەکانت بدە بە با

پەنجەکانت بدە بە با
با
هەواڵی تازەی
لە سەر دایە و
لە زەینی دا ماوە
دڵتەنگییەکانی
هەموو ئێوارەیەک.

# ڕووناکی‌یەک

ڕووناکی‌یەک
لە ورشەی
هێمای وشەکانت دا.
سووتانێک
لە هاڵاوی هەناسەی من.
چ تەعبیرێک
گەشتر لە ژیلەمۆ!.

## ڕێبواری فەرامۆشی و ...

ڕێبواری فەرامۆشی و تەنیایی
جانتای بۆن و بەرامەی سەفەرت
دوور... دوور خەوە
لە ڕەنگاژۆ و
بۆ ژۆی ڕابردوو
دیسان سەفەرە و
جانتاکەت پڕاوپڕی ویستی سەفەر کە
هاوڕێ
ئۆغر بێ!

٧ ٧ ٧

